چیرۆکە شێعری



« چیرۆکی فەرهادی سەردەم »

لە نووسین و هۆنینەوەی

**ڕەزا نووری پوور**

سرشناسه: نوری پور، رضا، ۱۳۵۷ -
عنوان و نام قراردادی: فرهادنامه: شعر کُردی / رضا نوری پور.
مشخصات نشر: سنندج، ناشر : آراس، ۱۳۸۸.
مشخصات ظاهری: ۱۰۲ ص.
عنوان کُردی : فەرهادنامە : چیرۆکە شێعر
یادداشت: عنوان : چیرۆکی فەرهادی سەردەم - موضوع: شعر کردی - قرن ۱۴ -
رده بندی کنگره: ۹ف۷۴۳ن/ ۳۲۵۶ PIR / ۱۳۸۸ - رده بندی دیویی: ۸فا۹/۲۱
شماره کتابشناسی ملی: ۶۵۰۴۶۷۱

چیرۆکە شێعر

# فەرهادنامە

رەزا نووری پوور

ناشر : آراس
تیراژ: ۱۵۰۰ نسخه - چاپ اول - زمستان ۱۳۸۸ — سنندج
پیتچن و پەراوێزگەر: راشد نەسیری
تەرحی رووبەرگ : لوقمان کەریمی
سیامەشق : شێرکۆ مەلەکی
شابک: ۲-۶۷-۸۶۲۰-۹۶۴-۹۷۸
بها : ۱۵۰۰۰ ریال
ناوەندی بڵاوکردنەوە: پاساژ عیزەتی - بڵاوگەی کتێبی ئیمام غەزالی
تلفکس: ۲۲۵۶۱۰۰ — ۰۸۷۱

پێشکەش بەو شیرینەی
ئیلهامی شێعری کردم

## پێشەکی

سڵاو بۆ تۆی خوێنەری بەڕێز و هێژا

من شاعیرنەبووم یان تا ئەو رادەیەی نەبووم زاتی وام هەبێت بوێرم کۆمەڵێک نووسینی هۆنراوەییم لە ژێر ناوی شێعردا بڵاو بکەمەوە، بەڵام خەمەکانم، خەمە تاکەکەسیەکانم زۆریان لێ کردم خۆ لە قەرەی شێعردەم، هەر وەک خەمەکانی بەکۆمەڵ و بۆ کۆمەڵ زۆریان لێ کردم دەس بدەمە نووسین و رۆژنامەگەری ... ئیتر با بوەستێ چی بوو چۆن بوو لێی هەڵاتم سەرم بەماڵیدا نەکردەوە.

جاری وا هەیە خۆشت نازانی چۆن و لە کوێوە بوە لێرەدا وەستاوی کە ئێستا هەیت، زۆر جار نەخوازراو ڕێبواری ڕێگەیەك بوویت کە ڕۆژێك بە بیریشت دا تێنەپەڕیوە. ئەمە لە وتەی فولك و قسەی سەر زارەکی خەڵکی پێی ئەڵێن قسمەت یان ناویان وا لێناوە. جا منیش با بە قسمەتی بزانم چۆن دەستم دایە شێعر نووسین.

هەر چەن من کولێجی زمان و ئەدەبم تەواو کردوە، بەڵام هیچکات ئەو بوێری و زاتەم لە خۆدا نەدەدی هەڵکوتمە سەر کارێکی وا وەك هۆنینەوە، نەخوازەڵا ڕۆژێك لە ڕۆژانیش بمهەوی کۆمەڵێ شێعر وەك نامیلکەیێك بڵاو بکەمەوە.

نووسەرێك وتوویەتی ئەدەب زان و ڕخنەگر وەکوو خواجەی حەرەمسەرایە کە ئەزانێ ئەبێ چ بکات بەڵام هیچی لە دەس نایە.

وەرگرتنی تکنیکەکانی چۆن نووسین و چی نووسین تۆ ناکەن بە شاعیر یان نووسەر هەر وەك چۆن نەزانینیشیان ڕێگرت نابن بۆ ئەم مەبەستە.

هەرئەمە وای کردوە هەندێ هەستناسك و دڵتەڕی لێزانی خاوەن هەست خۆ بهاوێنە ئەم رووبارەوە و چاکیش مەلە بکەن، لە هەمان کاتیشدا دیواری شێعرلە هەموو دیوارێکیش نزم و تەسکتر بکاتەوە کە

هەرکەسێک ڕێگە بداتە خۆی هەر دڵی تەنگ بوو دڵتەنگیەکانی بنووسێ و ناویان لێ بنێ شێعر.
زۆرخۆمم بە نووسین و خوێندنەوە ماندووئەکرد،ئەمنووسی بەڵام نەمدەوێرا بهۆنم و بهۆنمەوە. لەراستیشدا نووسین ئاسانترە تا هۆنینەوە، ئەگەر بتەوێ بە راستی نووسینەکەت تامی شێعر بدا.
وەک لە سەرەتا نووسیم خەمە تاکەکەسیەکانم کزەییکیان لە دڵ کردم کە ناخواستە منیان هاویشتە ناو دونیای شێعرەوە.
ڕەنگە سەیر بێت شەو بخەوی و بەیانی لە قەراغی جێگەکەتدا بە خەتی خۆت شێعرێکت نووسیوە و خۆشت بە باشی لە بیرت نایێ کە ئەم شێعرەت چۆن نووسیوە. ڕەنگە لای هەندێ کەس ئەم چەشنە جۆرێکی زۆر ڕۆمانتیکی بێت یا خۆ لە درۆ کردن نزیک بکاتەوە. بەڵام ڕوو ڕاستم لەوەیدا کە بڵێم گڕوگاڵی شێعری من دەسپێکێکی وای هەبوە، کە ئێستاش بە تاسەوەم جارێکیتر بتوانم لە دونیای بێداری دا شتێکی وا بنووسمەوە. تەنیا ئەوەی کە لە بیرم ماوە، لە بیرم دێ شەو بە دەمی هەنیسکەوە شتگەلێکم نووسی کە زۆر لێی تێئەفکرم لەمە زیاتر هیچم بە بیردا نایێ. هەر ئەوە و دوابەدواش کزە و کسپە و داخی ڕۆژانەم لەو ماوەیەدا و ڕۆژانی دواتر هانیاندام خۆم بهاوێمە داوێنی شێعرەوە بە بێ ئەوەی پێش زەمینەیەکی زەینی لەم کردەوەیەم لە مێشکدا بێت.

هەرچەن لە شێعری خەواویم بیر ئەکەمەوە لەمە نزیکتر ئەبمەوە کە ئیلهام لەگەڵ خۆی تکنیکیش ئەهێنێ، بەڵام پێویستە لە پێشدا پێش‌زەمینەی تکنیکی لە زەینی شاعیرەکەدا هەبێت. تێکەڵبوونی ئیلهام و تامی هەست و ئێحساس و تکنیک ئەبنە ئەوەی رخنەگران پێی ئەڵێن شێعری ناب.

من لە وێزەی ئەوەدا نیم کە بڵێم شێعری من دێتە ئەم خانەوە، بەڵام ئێستاش کە ئێستایە بنەمای فیکری و تکنیکی ئەوانەی شێعرم ناو لێناوە بە دەوری یەکەمیاندا دەخولێنەوە ئەخوازن باڵای خۆیان بە باڵای ئەو بگەیێنن.

چیرۆکی دەسپێکی شێعری من شتێک بوو بەم ئاسانیە و ئاساییە. بەڵام با خۆم بیزانم ئەو شەوە چم بە سەرهات و چەن برک و ژانم کرد تا یەکەم شێعرێ کە من خل بکاتەوە بەرەو ئەم مەبەستە، هاتە نووسین. چما بۆم لە وتن نایە.

فەرهادنامە هەر ئەو چیرۆکەیە کە باس لە شەوان و رۆژانی بێ دەرەتانی و دڵتەنگی و ناشادی ورەنجەڕۆیی و بە دەگمەن خۆشحاڵی و خۆش وەختیم ئەکات.

لام وایە رۆحی فەرهاد هەموو جارێ تەناسوخ ئەکاتە گیانێکەوە و دیسانەوە سەر هەڵدەداتەوە و ئەمجاریش حلوولی کردۆتە جەستەی فەرهادی ناو چیرۆکە شێعری فەرهادنامە.

بۆ ناوێرم ئیدیعا بکەم فەرهادی سەردەم منم، نازانم! ئەگەرچی ئەمەم بە راشکاوانە لە ناو شێعرەکەدا و لە بەشی "گرێ پووچکە" دا هێناوەتەوە و گیانی خۆمم لەگەڵ گیانی فەرهاددا وا گرێداوە بۆت لێک نادرێتەوە ئەوە "فەرهاد"ە یان "رەزا"یە!

بە هەرحاڵ فەرهادنامە بە شێوەیێکی گشتی خەمنامەی فەرهادی سەردەمە. فەرهادێک کە دێتەوە و لە عەشقی باوی رۆژیدا ئەتلێتەوە و قوڵینگی بێستوونێکی سەردەمیش دینێتە کایەوە و لە کزەی عەشقی شیرینی سەردەمدا خۆ ئەگەوزێنێ و چرۆی یادی شیرین لە ناو دڵدا ئەروێنێ.

فەرهادی سەردەم تەنیا کاری دڵداری نیە. هەژار وتەنی کاری زۆرە و لە زۆرێک لە کەل و قوژبنەکان سەر ئەکێشێ و پرسیار ئەکات و ئەدوێ.

عەشقی سەردەم فێری فەرهادی سەردەم ئەکات بۆ عەشقی خۆی بنەمایێکی ئایدۆلۆژیک دارێژێ و رەنگە پێغەمبەرەکەشی هەر بۆ خۆی

بێت. ئەگەرچی جێ و شوێنی خەیامیسم و شێخی سەنعان و تەمی وانەکانی مەهاتما گاندی وکەسانی تریشی پێوە دیارە.
من نازانم کارێکی باش ئەکەم یان نە،کە ئەم پێشەکیە لە سەر ئەم چیرۆکە شێعرە ئەنووسم یان ئەوەی خەریکم وەك رخنەگرێك هەندێ لایەنە شاراوە و ناشاراوەکانی ئەم بە ناو شێعرانە دەرئەخەم. بەڵام لەوەی دڵنیام دونیای ئەم فەرهادە ئەوەندە پان و بەرینە دەشێ بەوەی ساڵەهای ساڵ شێعری شاعیرێك خۆی بە مەبەستی نواندنی فەرهادایەتی فەرهادی سەردەم تەرخان بکات و بینوێنێ و بنوێنێ.
فەرهادنامە کزەی دڵێکە سادە، ساکارو ڕووڕاست لە گەڵ خوێنەرەکەی. مەگەر نە ئەوەی لە دەمانێکدا فەرهادنامە بەدوای نواندن و خوێنەرەوە نەبوە و تەنیا سۆزێکی تاکەکەسی بوە بۆ دامرکاندنی کوڵ و کۆ و زاخاوی دەروونێك و ئیتر هیچی تر.
رەچەڵەکی ئەم چیرۆکە ئەگەڕێتەوە بۆ پائیزی ساڵی ۸۰ ی هەتاوی و هەتا ئەمڕۆش کە هەر درێژەی هەیە و بێگومان دوابەدوای ئەمەش هەر درێژەی ئەبێ.
کە دەستم کرد بە نووسینی یەکەم دێڕەکانی فەرهادنامە تەنیا کزەیێکی دڵداری و دڵدانەوە بوو، تا هێدی هێدی چرۆی ئەم بیرۆکەیە باڵای کرد و فەرهاد بوو بە چیرۆکی فەرهادی سەردەم.

بە بێ ئەوەی لە خەیاڵما بێ ڕۆژێك فەرهادنامە ببێت بە دەفتەرێکی شێعر و بڵاو بکرێتەوە.

بەڵکوو تەنیا هەنیسکێك بوو بۆ دامرکاندن و زاخاوی دەردێکی پڕ ئازار.

هەندێك لە بەشەکانی لەکاتی دیتنی دیمەنێك، هەندێکی لە کاتی پیاسە و بڕێکی لە سەفەر و تاقمێکی لە خەودا و بەعزێکیش بە دەم فرمێسك و گریانەوە هاتنەتە نووسین.

جاری وابوە خۆم مولزەم بە نووسینی شێعرێك کردە کە پشت ئەستوور بە تکنیك و جوانکاریە ئەدەبیەکان بێت، جاری واش بوە نووسینەکە سەرچاوەیێکی ناخۆئاگای بوە خۆشم نەمزانیوە چۆن بوە و لەکوێوە هاتوە، وەك ئەوەی دەروون ناسان پێی ئەڵێن "جریان سیال ذهن".

ئەوەی ڕاستیش بێت بۆ خۆم زۆرتر ئەوانەم لا پەسەندترە کە لە دونیای بێ ئاگایی و ناخۆییەوە سەری هەڵداون. هەر چەن بە جوانی دیارە لە زۆر شوێندا کێش و ئیقاعی شێعرەکە لە سەر کێشی خۆی نەماوە و بۆتە هەڵەیێك کە باری ئەدەبی بوونی هەر هەموو بەشە تەواوەکانیش دائەبەزێنێ.

بەڵام لەپێدا نەچوونەوەیان تووشی هیچ مەترسییێك نەبووم و نابم لـەبـەر ئەوەی لە یەکەمجاردا ئەوەی هاتوە رووداوێکی روو راستانەی زەینـی فەرهادانەییێکـی سـەردەم بـوە و لـە لایێکـی تریشـەوە وەکـوو دابێکـی ئەدەبی بۆ فەرهادنامەی لێهـاتوە. لـە هـەر شـوێنێك فـەرهـاد لـەکـەنـد وکۆسپ و ئێش و زامێکی رۆژانەیدا تلاوەتەوە، ئیتر بیری لای شێعر و مێعر و تکنیك و کێش و جوانکاری نەماوە و خۆی دات بە دەم شـنەی خەفەتێکی گیان پسێنەوە و "ئێجگار سەری لێ شێواوە".

رەنگە هەندێ کەس جیا لەوەی نووسینی ئەم پێشەکیە بە باوێکی نا بـاو لە لایەن منەوە وەك خاوەنی ئەم شێعرانە بزانن، لە هەمان کاتیشـدا ئـەم بۆچوونەم وەك پاسادانەوەییێك بدەن لە قەڵەم بۆ داپۆشین و داشاردنی هەڵە ئەدەبی و پێداویستە سـەرەکیـە پێویستەکـان بـۆ بـە شـێعر بـوونی شێعرێك. بەڵام من خۆم لەم رخنەیە مەعزوور ئەزانم. من ناکێشی و بێ تکنیکی وەك تکنیکی فەرهاد پێناسە ئەکەم. ئەم تاوانە، تاوانی من نیـە. ئەگەر تاوانێکیش بێت بە تاوانێکی سەرەڕۆیانەی نازانم. چبکەم فەرهاد سەری لێ شێواوە! بۆیە شێعریشی لـە هـەنـدێ شـوێندا لـە سـەر کێشـی

خۆی نامێنێ و وەک خاوەنەکەی بێ سەر و شوێن و بێ هیوا خۆ بە دار و دیواری وشەدا ئەدەن.

هەندێک لە دێڕەکان، فرمێسکیان لە گەڵ خۆیان هێناوە و لە گەڵ هەندێ فرمێسکیش‌دا شێعرێک سەری هەڵداوە.

فەرهادنامە چیرۆکێکی نامولزەمی شێعراویە لە ئێش و ئازار و برک و ژانی فەرهادی سەردەم. فەرهاد خۆی بە هیچ سنوورێک نابەسێتەوە و هیچ تەونە جاڵجاڵوکەیێکیش بە دەوری خۆیدا ناتەنێتەوە. لەم روانگەوە سەرەڕۆیە و بێ یاسایانە، تەنیا خەریکی دەربڕینی ئازارەکانە، ئازارەکانی تاکەکەسی و بە کۆمەڵ، کڵۆڵ و کۆلیل.

جاری وا بوە لە چلەی زستانێکی سارد دا لە سەر شەقامێکی سەهۆڵ بەندا، کزەی عەشقێک تێکەڵی توفی سەرما و زەمهەریر بوە و کە دەستم لە سەرمانا لە گوێ نەدەکرد، کەوتوومەتە بیری نیگای ساردی شیرینێکی ناشیرین و وتوومە:

"لە ساردی نیگات عەشقم لە گۆ ناکات".

جاری واش بوە قوڵپی گریانێک شێعرێکی لا نەزۆک کردووم و ئەوەی دەبوا ببوایە بە شێعرێک، بە فرمێسک دامخەرجاندوە و لە ناخۆدا

شێعرێك یان بەشێكی تر لە فەرهادنامە نەزۆك كراوە و جوانە مەرگ مراوە.

گەلۆ؛ ئەگەر ئەو هەموو دەفتەرە شێعرەی كە لە چاپ ئەدرێ ئاوا بەرهەمی ئەوەندە ئێش و ئازاری خاوەنەكەیانن، ئەی لەخوام داوایە تۆمی شێعر لە سەر گۆی زەوی هەڵگیرێ. لە خوام داوایە شاعیرێك نەبێ و نەمێنێ كە دەفتەری شێعرێكی بەرهەمی ئەوەندە ژان و ئێش و ئازار بێت.

یاخوا كەس وەك من نەكەوێ كۆستی...

بە گریانەوە ئەم دێڕانە دێنمە نووسین، رەنگە رۆژێك لە وتن و نووسینیان پەشیمان ببمەوە، بەڵام ئەمەش قسەی رووڕاستی دڵمەكە بە دەم فرمێسكەوە دائەبەزێتە سەر پەڕەی ئەم پێشەكیە نا باوە.

فەرهادنامە لای من ئاوا بوە، بۆیە درۆ ناكەم لە گەڵتانا. مواخیزی فەرهادنامە بم ئەگەر تەنیا دەردێكی دەردی واقیعم نەبێ و مواخیزی خوێنەریشی بم ئەگەر لە هەوڵدا بم شێعرێكی دروآوی بەم بە خواردی زەین و مێشكی تەنراو لە هەستی شێعرخوێنێكدا.

مواخیزی شیرینیش بم ئەگەر تاقە دێڕێکم وشەی ڕاستی دڵم نەبێ و لافی عەشقی پێوە دیار بێ. هانای بینابیم قوتار ببێ و سۆمای چاوم با نەمێنێ ئەگەر فرمێسکێکم فرمێسکی درۆ و ریا و تەزویر بووبێ.

...

جاری وابوە بۆ ماوەی چەن مانگ و تەنانەت بۆساڵیش بوە لە شێعرچوومەتەوە، بەڵام هەوڵم نەداوە خۆم بە زۆر بشێعرێنم و دەسکردی و تەسەنوع بهاوێمە ناو شێعرەکانمەوە.

زۆر جارانیش هێندە ئێش و دەرد و ئازار لە سەر دڵم بوە بە بار، نە توانای گریەم بوە و نە هێزی نووسینیش خزاوەتە مێشک و زەین و پەنجەمەوە.

فەرهادنامە لە هەندێ شوێن شێعر نیە، شیوەن و ڕۆ ڕۆ و باڵۆرەیە. هەنیسکی دەم گریانێکە و سۆزی سۆزەی عارفانە و عاشقانەی پیرە عاشقێکی دێرینە لە بەردەم تەکیە و خانەقای ڤیان و عەشق و دڵداری.

فەرهادنامە چیرۆکی عەشقێکی ئەفسووناویە، کات ناناسێ و بە دەم هەموو دیمەنێکی هەستەوەر و ئیحساسیدا چرۆ ئەکا و لە دڵی

شاعیرێکی ناشاعیردا پەلە قاژەی لە دایک بوون و رابوونەوە و هەندێ جاریش ئاویلکە و گیان هەڵات و بچوونەوە ئەکات. بوون و نەبوون فەلسەفەی تایبەتیان هەیە. کە حەز ئەکا نەبێ بۆ ئەوەیە بمرێ و فەرهاد ببوژێ و بێتەوە، کە حەزیش ئەکات ببێ، گڕووی عەشق هۆکاریەتی و مەرگی لە بیر ئەچێتەوە.

لە راستیدا مەبەستی سەرەکی، شێعر نیە. شێعر داردەستی دەربڕی هەست و نەست و هەنیسکانە. شێعر ئەبێتە ملوانکە و ئەئامێزێتە ئامێزی قسەی خۆشی خۆش ویستن و دڵداری. بێستوونەکانی سەردەمیش بە توون ئەسووتێنن گەڵای عومری هەرزەکاری.

مەگەر فەلسەفەی بوونی فەرهاد قەقنەسێکی بێ چارەنووس و بێچارە نیەکە گۆی زەوی بۆتە هەودای رمبازێنی فەرهاد و فەرهاد کوژەکان؟ مەگەر هەڵسەنگاندنی خەیام نەبوە مەودای مەیخۆرەوە و خوێن مژەکان؟!

دەبا فەرهادی سەردەمیش ببێتە قوچی قوربانی عەشقی سەردەم، جارێکی تریش روو رەشی بۆ بارەگای بێ بەزەیی و تەختی نادیاری ئیلاهەکانی ئەوین بمێنێتەوە.

دەبا فەرهادی سەردەمیش ببێتە هێمای ئازاری بێ بڕانەوەی مرۆ و
تاواندەری سێو و گەنمێکی تەماوی، کێ چوزانێ خواردیشی یان نە!
فەرهادی تۆڵە ئەستێن یان تاوانباری تۆڵەی خواکانی سیزییێف و رق
و کینەی بێ ئەمری دایە حەوا و باوە حەوا لە حاستی ئیلاهەی خیلقەت
و ئافراندن.

...

ناوەڕۆکی فەرهادنامە لە سەرتەوەرەی دوو بابەت ئەخولێتەوە؛ ئەوین
و کچ.
ئیتر هەرچی هەیە و نیە بە دەوری ئەم دوو باسەدا خول ئەخۆن و
ئەگەڕێن. لە هەرشوێنێك فەرهاد پرسیارێکی فەلسەفی هەیە یا خود لە
بابەتێك رادەمێنێ یان کەڵکەڵەییێکی رامیاری لە مێشکیایە یان بەرەو
رووی کێشەییێکی کۆمەڵایەتی ئەبێتەوە، لە هەر هەموو حاڵەتێكدا
رووی پەیڤی لە شیرینە و گلەیی و گازندە و پرسیار و فەلسەفە و
ئایدۆلۆژیای خۆی بە گوێی شیریندا ئەزرینگێنێتەوە.
عەشق گرووی هەموو مەراقەکانی فەرهادە و دەستە واژەی دڵداری و
حەزلێکەری تووتەمی فەرهادی سەردەمە.

شیرین هێمای هەوێنی بیر و باوەڕ و ئەوینە. ئامێژەنگای هەست و نەست و عیرفان و بەرخوێدان و بەرەنگاری و تێکوشانە. لە هەموو کردەوەیێکی‌دا راوێژ لە گەڵ شیرین ئەکات، هەرچی کوڵ و کۆی رۆژانەی بۆ بەردەم بارەگای شیرین ئەبات.

فەرهاد خۆی لە خۆیدا بوونی نیە. شیرین نەبێ فەرهاد چیە!؟

ئەوا فەرهاد بەردەنگێکە، زایەڵەی عەشقی شیرینە بۆتە سەودای ئەندێشەی پڕ لە پرسیار و تەماوی. عەشقی شیرینە بۆتە گڕووی رابوونەوە و رەستاخیزی فەرهادێکی هاوچەرخ،کە ئیترخۆیشی نازانێ دەستی کامە قەدەر لە ژیلەمۆی ئێسک و پروسکی کام قەقنەس ئاگری ئەم عەشقە خۆش ئەکات و ئەیگەشێنێتەوە. چما فەرهاد خۆیشی قەقنەس ئاسا نەبێتە خۆڵەمێشی رابوونەوەی فەرهادی سەدەکان و سەردەمەکانی دوایی!

فەرهاد و شیرینی سەردەم گیانێکن لە دوو جەستەدا،کە لە دوو خاڵدا گرێ ئەخۆن و ناپسێن؛ عەشق و فیراق.

هەرئەمەش بەسە بۆ ئەوەی گیانی فەرهاد وەها تێکەڵی گیانی شیرین بکات هەزار بێستوون هیوای دڵی فەرهاد نەبەزێنێ، ئەگەر چی فەرهاد لە حەسرەتی فیراق و عەشقی شیرین‌دا گاڵە و زاڵە ئەکات و بە هەزار

لەون مەرگی بێ کۆتایی چارەنووسی نادیاری شیرین و خۆی ئەلاوێنێ.

عەشقی فەرهادی سەردەم تراژیدیاییێکی نامۆ و کارەساتێکی نادیارە کە لە ئاقارێکی پارادوکس‌دا، شانۆگەری ئەکات و سناریۆی ناتەبای وەفاداری و بێوەفایی، وەسڵ و هیجران، مەرگ و ژیان و ژیانەوە ئەنووسێت و ئەنووسێتەوە.

...

«شیرینی من هێمایە، سەمبولە. لە زەوی دەس ناکەوێ. لە ئاسمان هێلانەی کردوە.»

شیرینیش، دڵدارێکی خاوەن تەنیا دوو میم و کافێک وخڕەی خرخاڵ و دەنگی پاوانە و گێلگێلە و شەدەی لار نیە. شیرینیش، شیرینی تەشی ڕێسی وەفایی نیە، بەڵکوو "کیژی وریای چاو کراوەی فێرە زانینی" سەردەمە. تەنانەت لە هەندێ شوێنیش‌دا پێگەی تەختی موڵکی شیرین لە سەر زەوینەوە بەرز ئەبێتەوە بۆ عەرشی ئاسمان و تێکەڵ بە دونیای متافیزیک ئەبێت.

شیرین هەرگیز بێوەفا نیە، ئەگەرچی لە زۆر شوێندا ئەبێتە جێی گلەیی وگازندەی فەرهاد. فەرهاد لە بێ تاقەتـی دڵـی خـۆی سـکاڵای دڵ لای شیرینەکەی هەڵنەڕێژێ ئەی چی بکا؟ ئەی تـەقـە لـە درگـای کـام بـێ خەبەری حاڵ نەزان بدا؟

هیجرەت و فیرقەتی شیرین ئاخنراوە لە زۆرە ملـی و جـەبـر و جـەوری کلتوورێکی پێنەگەیشتوو و تێنەگەیشتوو.

فـەرهـاد هـەژار، بێسـتوون هـەزار، ئیتـر مـەکـۆی گشـت خـەمـەکـان، سارێژەری گشت زامەکان، بۆتە جێژوانێکی نامۆی شـیرینێکی سـیمین عوزار. ئەو شیرینەی قەتیس ماوە لە نەریـت و دابـی کۆنـە پـەرەستی و نوستالژیایێکی پڕووکێنەر، تەریدەی ژووری تەنیایی. غـەریـب لە شار و زێد و ماڵ و حاڵ.

تۆ گوتت

من تەریدەی خاکی هەندەران

ئاوارەی ناو تاریکترین کووچەی دنیام

بەڵام من لە شاری خۆم

له زێدی خۆم

غەریب غەریب

تەنیا تەنیام

رەحیم لوقمانی - زامستان

تۆزێکی‌تر دەس بەی لە لێوم هەرچی راستی قسەی دڵمە بە پەخشان ئەپەخشێنم و ئیتر واز لە شێعر و هێما و سەمبول دێنم. ئاخر چی بڵێم فەرهاد زەخمی نەشتەری درۆیە، زاماری بێهوودەیی و بێ دەرەتانی جیهانێکی سەرەڕۆیە، کە هێمنی و ئاسوودەیی بۆ ئەویندارانی رجوا نابینێت.

...

با ئیتر واز لە گڕوگاڵی دەم بێشکانەی مەراق بێنم و بپەرژێمە سەر سپاس و پێزانینم بۆ ئەوانەی باسکی هێز و هەتوانم بوون ودەستی یارمەتیان گرتم.
جارێکیان برای شیرین و لە بەردڵانم "حوسێن سەتاری" وەک هەموو جارێ لە دەلاقەی دڵسۆزیەوە وتی؛ رەزا ئەمجار کە هاتیەوە حەز ئەکەم فەرهادنامە لە بەندی کوتە کاغەز و لەت و پەتی و بڵاوی دەربێنی و کۆیان بکەیتەوە. سپاسی ئەو ئازیزە ئەکەم کە دوای ماوەی

چەنساڵ، کەڵکەڵەی ئەم کارەی لە دڵما هەژاند و هەر ئەویش بوو تۆمی ئەم بیرۆکەیەی بە مێشکمدا پژاند.
زۆر سپاسی گەورەیی و لێبوردوویی برای هەرە بەڕێزو دڵسۆزم کاک "راشد نەسیری"«سنە» ئەکەم کە بە تاقەتێکی زۆرەوە پیتی بۆ چنیم و پەڕەی بۆ رازاندمەوە و یارمەتی زۆری دام.
زۆر سپاسی مامۆستای بە توانا و شارەزا "سەید بەهائەدینی حوسێنی" «سنە» ئەکەم کە لە رەوتی لە چاپ دانی دا بۆئەم لاو ئەو لای بردم و گەلێک منەتباری خۆی کردم. هەرووەها سپاسی برام "کاک هوشیار یووزی" «سنە» ئەکەم کە پێداچوونەوەی بۆکردم وهەڵەی زۆری بۆ راست کردمەوە.
دەس خۆشانەی هونەرمەندی گەورە و پەیکەرتاش و نیگارکێشی لێهاتوو"کاک لوقمان کەریمی« سەقز» و خێزانەکەی خوشکە ئامینە فەیزی"/چیمەن ئەکەم نەخشی سەر بەرگیان بۆ نەخشاندم ولە هەموو ئامۆژگاری و یارمەتییەکی خۆیان بێبەش و بێوەرییان نەکردم.
دەستی یارمەتی خانەوادەکەم، دایک و خوشک و برا و کەس و کاریشم ئەگووشم کە لە هیچ یارمەتییەکی مادی و مەعنەوی خۆیان، درێغیان لێ نەکردم و پاڵپشتی تەواویان کردم.

فەرهادنامەش پێشکەش بە هەموو شێعرخوێنێکی کورد ئەکەم بەو هیوایەی بەرکوڵێک بێ بۆ پێشخوانی کتێبخانەی کوردی و تکا لە خاوەن رایان و لێزانان ئەکەم لە ئامۆژگاری و رێنموونی و رخنەی خۆیان بێبەشم نەکەن.

منەتباری ئەو کەسانەم بە چاوی وردەوە لەم نامیلکەیە بڕوانن، منیش وەکوو برای خۆیان بزانن، ئەم بەرهەمە بە بێژنگی لێهاتوویی ببێژنەوە و هەڵەکانم پێ بێژنەوە.

رەزا نووری پوور زستانی ۸۷ — سەقز
rezanouripour@yahoo.com

## ناوەرۆک

# گڕێ پووچکە[1]

فرمێسکی قەڵەم لە دەفری خامە

بوون بەو نامـەی قەت نەخوێنرایەوە

قوڵینگی هەنگاو بێستوونی شەرم ئەڕووخێنێ

عفریتەی "نا" فەرهادی سەردەم ئەمرێنێ

ئەی خەڵکی سەر گۆی ئەم زەویە

فەرهاد سەری هەڵدایەوە

فەر

رە

هاد

زا

---

[1] ئاڵای فەرهاد

# بانگەواز

عەشق عەشق

کێیە ڕێگر؟

چیرۆک چیرۆک

کێیە گوێگر؟

لە جیهانی ئەلۆ ئەلۆ و تەلەفیزیۆن و سەتەلایت

کێ حەز ئەکا من باسی چیرۆکی بۆ بکەم؟

حەیرانی دڵداری بچڕم

چیرۆک چیرۆک

کێیە گوێگر؟

کێ حەز ئەکا باسی فەرهادی سەردەم کەم؟

قوڵینگی یادی ئەو جارە لە سینگی کامە بێستوون دەم؟

عەشق عەشق

کێیە ڕێگر؟

...

## کارەسات

سەد مخابن
بە هاتنی هەر فەرهادێک
بێستوونێکیش سەر هەڵدێنێ
عەشقی فەرهادی ئەم دەمە
خەمی نانە ئەیسووتێنێ

## پەیامێک بۆ شیرین

دڵنیا بە شیرینە خوێن شیرینەکەم
دڵی فەرهاد جگە لە تۆ
جێگای کەسێکی‌تر نیە
زویر مەبە

چاو تەڕ مەکە
باخی وشکەڵ ڕێژنە بارانی بۆ چیە؟!

## شەوان بێداران

کە منداڵ بووم وام ئەزانی لە شەوانی ئەنگوستە چاو
تەنیا دزەکان بێدارن بە شەو
بەڵام لەوەتای یەخسیرە دڵم لە بەندی کۆت و زنجیری تۆدا
لە قامووسی شەو بێدارانا
عاشقیش بۆتە شەوگەڕی بێ خەو

## نیگەرانیەکانی فەرهاد

نیگەران نیم لەوەی نامەی پڕ حەز و تاسەم ئەسووتێنی

گەڵای عومری تازەلاویم

بە خەزانی بێوەفایی ئەوەرێنی

بەڵام گیانە نیگەرانم

زۆر نیگەرانم هەر وەك ئەوەی کە لە لای من مردبێتی

هەرزە کارێك دڵی بۆ خۆی بردبێتی

## گلەیی بێت

شیرین دڵدار

ئەو تنۆکە فرمێسکانەی گلار گلار

لە چاوانت ئەتکێنە خوار

ئەیخەوێنم بۆ شەرابی عەشقێکی نوێ

کە من هەموو شەقام و شاری دڵمت

بۆ لیپاولیپی کزە وکسپەی گۆرانی کرد

ئەی تۆ چت دی؟

لەکۆڵانە بە قوڕ گیراوەکەی دڵتا

سوزەیێکت

تەنیا و تەنیا سوزەیێکت ڕەوا نەدی؟!

## مەسیلە

ئەوە چیە؟

وەك عەر عەرە

دار نیە

لام گەورەیە

شار نیە

زۆر گەستوومی

مار نیە

ئەوکاتەی بووم بە ملوانکە و پێچرامە گەردنی

پچڕاندمی

کە بووم بە کەزیە و ئاڵۆزامە ئامێزی

پساندمی

بووم بە شێعرێک، نەیخوێندمەوە

دڕاندمی

کاتێ تاسەی باڵایم کرد نەیدواندم

تاساندمی

بووم بە پاساری گوێسوانی، دانی نەدام

فڕاندمی

...

ئەوە چیە ؟

( نە دارە ، نە باڵندەیە)

ئەوە کچ نیە، دڕندەیە

ئەوە کچ نیە ، دڕندەیە

## دەمامک[٢]

بیستوومــە ئەڵێن گریـــــان گچکەڵە مەکــری ژنە

فرمــێسك و عەشـــقی درۆ ئافـــەتی دڵی مـــــنە

دە بڕۆ فرمێســـکەکانت لای یەکی دی هەڵــــڕێژە

گەر حـــــەزێکی منت بوو لە گــۆڕی دڵ بینـــێژە

گریـــــانی ژنە لای من بانێـــــك و دوو هەوایـــــە

فرمێسکی ژن و بایێك لای من وەکوو یەك وایـــە

---

[٢] ناوەڕۆکی ئەم بەشە لە حەقی هەموو ژنێکدا تەواو نیە، بەڵکوو ئەمە تەنیا باس لە فرمێسك و عەشقێکی درۆ ئەکات کە ئەزموونی تاکەکەسی فەرهادە.

# زاڵەکانی فەرهاد «تەوسین»

قوربانت بم بمخنکێنە
دەس بنێ گەرووم
بمتاسێنە
دەخیلت بم حەوتووی ژەمێ نانم بەرێ
ماڵەکەی خۆم بکە زیندانم
کارێ بکە لە بیرم چێ‌کە ئینسانم
ئەوین بۆ من یاساغ و بڤەیە
ژن بەس بۆ ماڵی تۆ رەونەقە
لای ئێمە هاژە و گڤەیە
تکا ئەکەم دیاری بکە کە بیر لە چی بکەمەوە
فێرم بکە چلۆن بژیم
خەرمانی ژینی خۆم بەلای کام رەشەبا هەڵدەمەوە
تکا دەکەم دیاری بکە پێنوێنەکەم لەکوێ راخەم
رووگەی کڕنۆشی ئەم جارم کام لا بێت و

سەری سوژدەم بەرەو کامە تەلاری پیرۆزت داخەم

دەستت بێنە با رایبوێسم

من نۆکەرەکەی ئەم دەمە

قەرەواشەکەی ئەم چاخەم

وانەکانم ئەڵێمەوە[۳]

نەخوازەڵا لە بیریان کەم

لە بیری خۆمیان بەرمەوە

بەهار؛

چەپەڵترین وەرزی ساڵە

گوڵ؛

دێو جامەی جنۆکەیە

کچ؛

بۆ تۆ نەبێ تورش و تاڵە

مانگەشەویش؛

درۆیێ زل

---

[۳] بۆ دانانی ئەم بەشە لە دوایین بەشی شێعری ناوداری عەشق وئازادی مامۆستا هێمن کەڵک و ئیلهامم وەرگرتوە

شێعری تەڕ؛
خەونە، خەیاڵە
بادەش؛
بۆ تۆ، لای من ڕەنجێکی بەتاڵە
هیچم ناوێ
هەرچی هەیە پێشکەش بە تۆ
ژیانێ بێ بژیم بۆ تۆ
زیادە لە سەر
هەر شەش دانگی کانی ژیان
تەمەن درێژی خدر بۆ تۆ
ئەوەش هەمە فراوانە
سپاس لە خوا
شوکر بۆتۆ[٤٧]
بۆ خۆت وا بارت هێناوم ئاسوودەیی ئەمتۆقێنێ
رجا ئەکەم فێری خۆڕاگریم بکە

---

[٤] سنەیی وتەنی "سێف سوور بۆ دەس کور خان خاسە"

نه وەك كاتێ توند لێم ئەدەی
هەرا و گاڵەم بتڕەنجێنێ
مەگەر نازانی تا هەتاو قرچەی نەهاوێتە سەرم
باخی بەری من پێناگات!؟
مەگەر نازانی تا نەمرم
فەرهاد هەرگیز سەر هەڵنادات!؟[٥]
چاك ئەزانم لە هەركوێ بێ قابیزی ڕۆحی من تۆی
تكا ئەكەم بمخنكێنە
حەیفە سێدارە خەسار بن
دایان بنێ بۆ ڕۆژی خۆی
بوونەوەرێکم هیچ نەزان
گێل و گەوج و ئاماتۆر
حەیفە بژیم
دەی بمکوژە
دەی دیکتاتۆر
دەی دیکتاتۆر

---

[٥] بۆ ئاگاداری زۆرتر لەم بابەت و باوەڕە بڕوانە بەشی "ئایدۆلۆژیاکانی فەرهاد"

## من کێم؟

«فەرهاد لە خۆی رائەمێنێ»

خۆ من وەلی دێوانە نیم ناوت وەك شەم لە دونیا دا بزرێنم
خۆ بێتهۆڤێن نیم لە بۆ ئەلیزابێتدا بتژێنم
خۆ حەسەن زیرەکیش نیم
هەموو رۆژێك لە گۆرانییێکدا بتخوێنم
خۆ من...

من رەزام و ناوی بەرزت هەموو رۆژێ
وەکوو جامێ شەراب ئەخۆمەوە
خۆ ناوێرم ناوت ببەم
بۆیە لە توێی ئەم شێعرەما
بە ئیهامێك ئەتشارمەوە
من لە جەرگەی خێڵی فەرهادم
ئاویەریش بێستوون ئەکەم

له سه‌یرانی ئه‌م عه‌شقه‌ما

شان له شانی قه‌یس و کاکه‌مه‌م و شێخی سه‌نعان ئه‌ده‌م

من سکرتێری هه‌ڵۆم

پاسه‌وانی قه‌لم

له ئاسمانی به‌رزه‌فڕیا

باڵنده‌یێکی بێ په‌لم

ئێمه شه‌هیدانی زیندووین

گه‌رچی ماوین به‌ڵام مردووین

هه‌ر که ده‌ژین و ده‌بینم به‌کاری هیچێک ناین

ئه‌ڵێم خۆزگه

خۆزگه به‌ردێک له ده‌ستی مناڵێکی فه‌له‌ستینی باین

گه‌ر شیرین بام؛

ته‌شی جوانی تۆم ده‌ڕست

ئه‌گه‌ر بت په‌رست بام؛

قه‌ڵه‌مێکم ده‌په‌رست

عه‌شق کار و پیشه‌ی منه

له لای من وه‌فا و دڵداری

خۆ بەخت کردن و فیداکاری
هێمای گوڵی دەستەچنە
پەروەردەی باخی ئارەزووی بەدی نەهاتووی بێدادم
عاشقێکم لەم سەردەمە
من فەرهادم

من فەرهادم

## ئایدۆلۆژیاکانی فەرهاد

هەڵاڵە و سوێسن و بەیبوون
رۆژێک میوان داری بەی بوون
کە دی عاشقێکی رێبوار
پەسەندی کرد ئەم دیمەنە و بڕیاری دا
دەستەچنی گوڵاڵە و بەی بکا بە دیاری بو دڵدار

هەڵاڵە و سوێسن و بەیبوون
بەیی پڕ چنگی شەکەر لێو
بوون بە میوانی دەستی شیرین دڵبەرێکی نازدار
ئێستا رزگار و ئازادن
لایان تەوفیرێکی نیە وەرزی زستان بێ یان بەهار
ئەو رۆژەی وا بەرەو پیری بوون و مانا
بۆ پێشوازی دەستی دڵدار
بوون بە ئیکسیری یادگار
پەرژینی مەرگ
پاراستی ژینی تا هەتایی
مەرگ بوو بە بیانوویێک بۆ رزگاری بێ کۆتایی

...

شیرین دڵدار
مەرگ یانی هیوا و ئامانج
رێچارە بۆ گەڕانەوە

سەودایێکی پڕ لە قازانج
شیوەن یانی پێکەنینێ کە بۆ خۆشی کاتی مەرگ
سەر لە دڵی مرۆڤ ئەکات
مەرگ هەر ئەو بەڵێنەیە
کە من بەرەو ژیان ئەبات
ئەسرینی مەرگ بارانێکە
کە گۆرانی ژیانەوە بە گوێی من و تۆدا ئەچڕێ
هەرکەس مانای مەرگی زانی
رۆژێ هەزارکەڕەت ئەمرێ

...

مەرگ ئاڵای ئازادیە
چۆپی چەمەر سەمای خۆشی
نوێ بوونەوەی ژیانێکی پرتووکاوە
ئەگەرچی ئێستا فەرهادیش لە گۆمی ژیندا خنکاوە
بەڵام نائومید و مەلوول نیە

خۆ درگای مەرگ دانەخراوە

...

شیرین دڵدار

لە دەستی خۆت جوان بڕوانە

هەڵاڵە و سوێسن و بەیبوون

لە پاش مەرگ

گۆرانی بۆ عەشق ئەڵێنەوە

ئێستا بەی وە کوو شەمامە

لە دەستتدا ئەخولێنەوە

(سڵاو مەرگ

سپاس عەشق)[6]

---

[6] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە بەشی "زاڵە کانی فەرهاد"

# سێزده بەدەر

ئەم ژیانە کە سێزدەیە
ڕۆژێ جارێ بە دەری کە!
کە جەغزی گۆی ئەم جیهانە
دەسپێك و دواپێکی یەکن
قوڵبەستەی نێوان قوتری یەك وەهم و دوو نەبوونین
لەو کاتەوەی مرۆ لە مەمکی دایك ئەبڕێتەوە
هەتا مەمکی مەرگی لە زار نەنێی
بە هیچ کەس ژیر نابێتەوە
...
هۆکاڵەبەی
لێم ئەپرسی بۆچی منیش خەمی بەرژەوەندی ناخۆم
هەر وەك بڵێی دڵ لە حاستی زێوی ژیاندا مردوە
مەگەر نەموت شیرینەکەم
چۆن بەکانی ژین دانووسێم؟
کە لە مێژە سێزدەی خۆم بە دەرکردوە

# فەلسەفەی ژین

هەرگیز لە مەرگ نەترساوم
بۆ تازەبووکی ئەم ژیانە
وەك زاواییێکی خەساوم

بەڵام باوان
ئەگەر عەشق گرووی مان و نەمانم بێ
بۆ ئەم ژینە سەد جار ئەمرم
قەزای ئەخەم لە دووچاوم

# فەرهاد و شێعر و شانۆ[٧]

(I)

رەشەبا دێ و منیش تەنیا

لە خەمخانەی ژوورەکەم دا تنۆک تنۆک

فرمێسک و ژان

لە یانەکەم ئەبنە میوان

مەلی ئاوات بۆ چڵی حەز ئەبەمەوە

.

.

.

(II)

پۆل پۆل کچان و کیژۆڵان

دێنەوە بۆ نێو مێرگوڵان و مێرگینان

---

[٧] ئە م بەشە کاتی خۆی لە حەوتەنامەی ئاویەرلە ژێرناوی "شێعرە شانۆ"لە چاپ درا و هەروەها لە شەوە شێعری "ڤیان"دا خوێنراوەتەوە.

دەستم لە بنا گوێچکەم ناوە
گۆزەی سوور و ئاوی شەوێ
بێ پسانەوە دەنگ هەڵئەبڕم
دەمم بە خاڵانت کەوێ
خاتوونە لۆرکێ و هە مووکچانی خەیاڵم
دێنە سەما و
دەسگیرانم چۆپی ئەوین ئەشەکێنێ
ئیتر منیش بۆ خۆم نابم
گەر یار لێو بێ ئەمن بزە و
ئەوگۆنا بێ منیش خاڵم

(III)

لە ناکاو دەنگێ ڕامدێنێ
ڕەشەبا دێ و منیش تەنیا
بایەقوژێکیش ئەقیژێنێ

# شیرینە هەوار

کە بۆ هەوار چووی
قەتارەی فرمێسك سەری کردە ناو چاوەکانمەوە
بوون بە کاروانی بەرەو ئاژوان
تەمی هەناسەم لە سەر لووتکەی کێو
لە بن قوژبن و کەل و دێ بنار
رەشماڵی هەڵدا
رۆحم چۆلەکەی بن گوێسوانی ئەگریجەکانت
لە سەر پرچی رەش
لە تاوتوێی تاڵێک کرایە میوان
کازیوەی هەوار،شەفەقی مەغریب
لە خوێنی دڵی من پاراو ئەبن
باسوور داگەڕێن دیمەنی ئاسۆی نیگای خومارت
هە ر چیم لا هەیە ئەیکەم بە مەیتەر
با بن بە هاوڕێی ڕێکەی هەوارت

خۆ ئیترمنیش لای خۆم نەماوم
هەر وەک کۆچەری بە شوێنتا وێڵە
لێت ناترووکێ پێڵووی دووچاوم

...

ئەوا جەستەشم شارێکی چۆڵە
ئەگەڕێ بێ هۆ
وەک لەپی دەستە
کەسی تیا نیە ئەم شارە بێ تۆ

...

باوانەکەم ؛
لە بیرت دێ ئێوارە تەگبیری پاییزە هەوار
کە پێم وتی
گەڵای هەستم هێدی هێدی وا لە سێدارەی نامۆیی ئەدرێ؟
ئێستا چنوور لوول و پەشێو
بە دوای زوڵفتدا گۆنای خۆ ئەڕنێ
وەنەوشەش مل کەچ
چەمەری خاڵی سەر لێو ئەگەڕنێ

...

له هیجرەتی ئەم هەوارە

روٚژمێری عەشق دائەرێژم

لە گەڵ وەیشوومەی هیجرانا

دێوزمەی خەفەت ئەچوێنم،

تەرمی دڵتەنگی ئەنێژم

هەوارەکەت سەرچاوەیە

بوٚ بژێوی و بووژانەوەی فەرەحی و دڵخوٚشی هەرێم

دەسا خێوەتەکەت هەڵدە

شیرین یاخوا

لە دەوری هەوارت گەرێم

توٚ وشەم بووی، هوٚنراوەم بووی

بووی بە چیروٚك

لەودەمەیدا بوٚهەوار چووی

***

باوانەکەم ؛

من شاعیرێکی نەزان نیم،کێشی شێعرم لی بگوٚڕی

کە دەبینی هۆنراوەکەم لە سەرکێشی خۆی نەماوە
چاك بزانە لە خەفەتی هەوارەکەت،
لە مەینەتی ئەم هیجرانە گیان پسێنە
ئێجگار سەرم لێ شێواوە

## لە جێژوانی ئەمجارەمان

شیرین دڵدار
لە جێژوانی ئەمجارەمان باسی رەنگەکانم بۆ بکە
نامۆ کراوم لە هەرچی سوور و شین و ئاڵ و واڵە
کە هاتمە لات
بمناسێنە بە رۆخی سەوزاییەکان
رزگارم کە لە زیندانی دزێوی زەردەڵی
شەکەتاوم لە حەساری بێ ئامانجی

زۆر بێزارم لەم ژیانە کرچ و کاڵە
بەڵێن ئەدەم
لە جێژوانی ئەمجارەمان
منیش باسی دلۆڤانی مێخەکە بێگەردەکانی
سەر سینگی دایکمت بۆ بکەم
لە فەلسەفەی هەنارەکان بدوێم
تارای تریفەی مانگەشەو بکێشمە سەر ئەم جێژوانە
تەژیت ئەکەم لە دڵداری
دەستە خوشکی شێعر وستران
ئاوێزانی ئامێزت ئەکەم
ئەی خوا لەم ئاگربارانە
گۆبەرۆکی هۆنراوەکان لە بەرۆکی خەیاڵت ئەدەم
هەرچی نەوتراوی سۆزە ئەدرکێنم
خشڵی نەخشاوی مرواری وشەکانم
ئەکەم بە لەرزانەی هەوری لاری سەروێنەکەت
هۆبەی هەرچی ئارەزوومە
بەرەو رووگەی خەرمانەی مانگی گۆنات هەڵئەدەم

...

پەنجەکانم لە گۆ ناکەن

شمشاڵی چیت بۆ بژێنم؟

قەڵەمەکەم گوارەی بێدەنگی لەگوێیە

کامە وشەت بە شێعرەوە بۆ بنوێنم؟

کە نەمزانی بە چ زمانێ بتدوێنم

بە گۆرانی دێمەوە گۆ

بە خۆرەتاوی ئاوازێک ئاسمانی خۆشەویستیمان ساماڵ ئەکەم

"لە ناو جۆلانەی دڵمدا

وەکوو ساوا ئەتلاوێنم"

شیرینە سەوزە

دانەی هەناری

روومەت گوڵی شەوچرای دیوەخانی دڵ

دەستەو لەملانی هێشووی ئەگریجەی شێواوت ئەبم

لە بەر قاپی خۆشەویستیت کڕنۆش ئەبەم

هەتا رۆژی ئەو رۆژەمان ئاوا دەبێ

کە تۆش هاتی

بزوێنە بزەی لێوان

بملاوێنە بە باسکی ناسکی دڵداری

ماڵی باوکت ئاوا دەبێ

هێندەی تاسە و خەمی دووریت

لە جێژوانمان، کەین و بەینی دڵداریمان

دێتە هەوێڵی راموسین

چلۆن بڵێم باوانەکەم

ئاقاری جێژوانەکەی ئەمجارەمان ئاوا دەبێ

## شێتانەکانی فەرهاد «خەلسەی ئەوین»[8]

هەور، هەور

تنۆکێ بوو

من ویستم لە دڵی ئاسماندا بشنێتەوە

(هەی هەناران و مەناران

یا خۆم دابکەمە باران)

ئەوە من بووم شێوەی شیرینم ئافراند

هەر منیش بووم

چیرۆکی فەرهادم خوڵقاند

ئێمە نەماندەویست رەسمی عەشق کوێر بێتەوە

"عەشق عەشق، چیرۆک چیرۆک"[9]

(اَلستُ بِرَبِّکُم...

---

[8] ئەم بەشە بریتیە لە شطحیاتی/شەتحیاتی فەرهاد

[9] ئاماژەیە بۆ بەشی بانگەواز

لە حەزرەتی بارەگای من

قوڕی فەرهادیان شێلا

هەر لە شیلەی ڕۆحی خۆیشم

تۆمی هەبوونیم داوەشاند

ئەوسا، مەزرای جەستەم کێڵا

(ما اَعظَمَ شَأنيِ...

من بووم تاقەداری ڕێگەی هەواریشم رواند

هەر منیش بووم

عەشقی دڵی فەرهادیشم دواند

تا هەڵەی عصیانی فەرهاد

بکە م بە بیانووی "هبوط"

لە مەودای دوو جەژنی قوربان

ئێمە ئاوەها زەویمان

بۆ رابوونەوەی مشیانەی عەشقێکی پیرۆز هەڵخڕاند

(تَبارَک لی...

(اَنَا...

(اَنَا...

(اَنَا اْلــ..

.

.

.

هەی هەی
خۆ من شێت نیم وەکوو حەلاج
قسەی دەمی خۆم نەزانم
کارێ بکەم بێ منەکانی من نەناس
رق هەڵگرن
بمدەن لە خاچ

# باشەکانی فەرهاد[10]

باری گوناح قورسی کردووم

لە کردەوەم پەشیمانم

ئەی خوایەگیان

لە پێش ئەوەی ناوی شیرین بکەی بە وێردی زمانم

باری گوناحم سووکتر کە

چاو لە تاوانم بپۆشە

بشۆرەوە هەڵەکانم

□

خوایە شیرین ئۆغر ئەکات

پێیان وتووم بارگەی بۆ هەوار پێکناوە

لەوساوە عەزمی باری کرد

---

[10] "باشە" لە ریشەی باش بە مانای "چاك و خاس" وەرگیراوە. باشە بریتیە لەو ویرد و ئەورادانەیکە فەرهاد تیایدا لە بەری خوا ئەپاڕێتەوە و دۆعا و سکاڵا ئەکات. بەکۆی دۆعا و ئەورادەکانی فەرهاد ئەکوترێ "باشەکانی فەرهاد"

سەقز چۆڵە وەك لەپی دەست

یەکسەر بێکەسە ئەم ناوە

خوایە بێبەری دیداری بەژنی شیرین گیانم نەکەی

لە هەواری ئەمجارەکەی

ئەگەرچەرخی چەپ دەگەڕێ و

دەوری دەوران دەوری ماوە

□

ئەی خوایەگیان

ئەو دوو چاوەی پێت بەخشیوم

دونیای روونی پێ ببینم

هێندەی عومرێکە گریاون

بارتەقای گریان و شینم

خوایە:

چاوم بۆچین خەساری فرمێسکان و ئەسرین بێ

پێشکەشی حەزرەتی تۆ بێ

بیکە بە فیدای شیرینم

□

خوایە شیرینم لێ نەبان نەکەی
لێم نەشاریەوە دوو دیدەی مەخموور
بەزەییت بێ بە دڵی شێواوم
ڕۆژگارم شەوە
شەوتری مەکە
نەیکەی بە دەیجوور
بیکە بە خاترخوێنی حەڵەبجە
بۆخاتر دەشتی سووری شارەزوور

□

ئەی خوایە گیان
ناسپاسی ژینێ ناکەم پێت بەخشیوم
نەیکەی بە تاوان و غەدرم
داواکارم کاتی مەرگم خاکی سەر ڕێگەی شیرین بم
ئەگەر هات و لێم رابووری
دەستی داوێنەکەی بگرم
گەر نەزانم بۆ کێ بژیم
خۆ ئەزانم بۆچی بمرم

□

ئەی خوایە گیان
شیرین بۆتە ژیواری ژین و ژیانم
خوڵقاوی تۆم
بەڵام لە دەستی شیرینە هێز و هزر و گوڕ و گیانم
شیرین نەبێ تراویلکەیە هەڵدێری تەمەن
دەبا قەزاوە گێڕی عومری شیرین بم
ئاخر بە بێ ئەو من ناموی لەشم
بوونەوەرێکی بێ ناونیشانم
خوایە:
بە دڵی شکاو هانام بۆ بارگەی بەرزت هێناوە
نزا و زاڵەم قبووڵ بکە
چاوی خێرت لە دەستم بێ و
لێم وەربگرە دۆعاکانم

# زانکۆکانی فەرهاد

خۆت ئیلهامی شێعرت کردم
هەرخۆیشت بووی
بۆ دیاری نادیاری
حەرف و پیت و وشەت بردم
دارە دارەی دڵداریشم
لە مەدرەسەی یادی خۆتا پێرەوکە بوو
ئەلف و بێی ئولفەتی لەنجەش
لە حوجرەی بەرزی باڵاتا
حونجی ئەکرا
کۆرپەڵەی هەست و نەستیشم لە باوەشی جێژوانتدا
بۆ سەیری باخی بەی ئەبرا
ساڵانێکیش
لە پشت کنکووری نیگاتا

بە فرمێسک و شەوبێداری
هەر لە زانکۆی چارەنووسی بێ دەرەتان
دەرست دادام و
لای خۆت فێربووم دەرسی ئەوین و دڵداری
وانەکانم دووکتێبیان لە سەر مەینەت
دوانی‌تریش درم ناسی[11] بێستوون ئەڵێن
سێ کتێبیش ئانالیزی فرمێسکم فێر ئەکەن
پەرتووکی پرتووکاوی خەم
لە تەلیسمی چاوت ئەدوێن
ئیتر هەرچی شێعرم هەبێت
هەرچی شۆرەی شۆرەکاتی شەونخونی و بێخەویمە
لە ژێر سایەی باڵات ئەڕوێن
دوو وانەشم رامدەهێنن لە یاسای هیجران وگریان
ئەوسا ئەبمە پسپۆری عەشق
ئەبم بە مامۆستای ڤیان

---

[11] Pathology

# دیارییەکانی فەرهاد[١٢]

لە بیرم دێ کە پێت وتم

بۆ سەفەرەکەی ئەمجارە

لە نەورۆزی ئەم بەهارە

دیارییێکم بۆ بهێنە

پەسەندی یادگار

لە رەنگی خۆر، چەشنی هەتاو

وەکوو دارە وشکەڵەکان

کە چاوەڕێن بۆ تۆزێ ئاو

وەك مانگەشەو زەرد و زەعیف

بەڵام قیبلەی دڵداران

---

[١٢] بۆ نووسینی ئەم بەشە لە تێکەڵەی سێ شێعری مامۆستایان "پەشێو، فایە ق بێکەس و شەریف" کەڵکم وەرگرتوە. ئەم بەشەی فەرهادنامەش کاتی خۆی لە حەوتەنامەی" ئاویەر" وهەروەها بلاڤۆکی "بیرۆکە" دا بڵاو کرایەوە.

هێن خۆڕاگر بێ و بەرزە مژ

تینووی بێت و هەرگیز نەناڵێ بۆ باران

ئازایەتی لە مێژووی کاوە دزیبێ

وەکوو هیوای گوێی زرێبار

بە چۆخەکەت عارەقت لە بۆی سڕیبێ

دیارییێکم بۆ بهێنە هەڵیواسم

وەکوو پێناسەکەی مێژوو

چاوی لێ بکەم خۆم بناسم

وەک گۆرانی دڵی خۆمی پێ بدوێنم

لە بیرم بێ

کە هاتمەوە

چەپکێ گوڵە هێرۆت بۆ بهێنم

# ساقیانەکانی فەرهاد

ساقی وەرە دەخیلت بم
خەم بڕستی لێ بڕیوم
ئازار سەری کردۆتە دڵ
دەسا وەرە
هەتا تاوی دەوران داوی نەداین
هەڵینەشێلاین بە یەکا و نەیکردووینەتەوە بە گڵ

□

ساقی وەرە پەشێوە شێوەی شێواوم
لە روخسارم رابمێنە
رەنگی زەردم ئیشارەتە
بە تەونی تاوی ئەوین و
تەشەنای ناسۆر تەنراوم

□

ساقی وەرە بەربەیانە
سەڵای کازیوە رەواندی
شەوە زەنگی ئەم شەوە
بە خۆشی شای شەکەر لێوان
دە تۆش وەرە سەرمەستم کە
هەتا شیرین مەستی خەوە

□

ساقی
قسەی راستت ئەوێ؟
سا گوێ بگرە لە منت کەوێ
لەم کۆنە زامەی لە دڵمە
ئەڵێن بە مەی چا دەبمەوە
لە من مەگرە بەوەی دەیڵێم
ـ وتوویانە مەستی و راستی ـ
ئەو قسەم لا ئەفسانەیە

کاتیٚ بمرم

بە زامی شیرینە دەمرم

لە قیامەتیش

بە یادی ئەو رادەبمەوە

□

ساقی کاتیٚ سەرخۆش ئەبم

گشت خەمەکان دیٚنەوە سۆ

چارەی خەمم بە مەی ناکریٚ

دەستی من و داویٚنی تۆ

پیٚک لە سەر پیٚک میوانم کە بە مەی

ئا گر بەردە لە جەرگ و دڵ و هەناوم

سپاسی خوا

بەختەوەری پیٚ بەخشیوم

سەودای شیرین لە سەرمایە

بە ئاگری عەشقی ئەویشە سووتاوم

□

ساقی؛
دەسا وەرە بمسووتێنە
هەرچی مەیت لە مەیخانە هەیە
لە دەفر و پیاڵە وجامی کە
روو لە من کە و لە خێڵی بێخەمان واز بهێنە

□

ساقی مەتەڵۆکی ژیان لای من روونە
وڵامی ئەم پرسیارە
خۆ تەوژمی بەربا نیە
چاک دەیزانم هۆکەی ئەم بوون و نەبوونە
هەرچی هەیە لە دیرۆکی ئەم کەونە کۆن و دێرینە
هەرچی دەسکردی خیلقەتە
ئەوەی ناوت ناوە ژیان
تەنیا یادگاری پرشنگی تیشکێکی عەشقی شیرینە

# بیرەوەرییەکانی فەرهاد

« لە رابردووەوە بۆ ئێستا و داهاتوو »

کە لە بێستوون گەڕامەوە

لە تەوافی ماڵەکەتان

ــــ لە کۆڵانی بێ مروەتان

لە مەرووەی جێژوانێکدا

بەرەو سەفای بزەییێکت

رووم کردە رووگەی هەوارت

دەستە و نەزەر

لە بەر قاپی پیری موغان

نزام ئەکرد بۆ دیدارت

کوێری چاوی فەرهاد کوژان

حەوت جار رەجمی فیراق ئەکەم

لە باتی دوو جەژنی قوربان

نەزری تیلەی دوو چاوەکەت

ساقە سەری ویردی "باشە"
قۆچی تەمەنی لاوێتی لە تێخی قوربانی ئەدەم
لە مەراقی جێژوانێکدا
لە تاسەی دیداری رووتا چاو ئەبڕمە درگا و بانت
ــ چەندە خۆشە میوانم بی
یا من ببم بە میوانت ــ
ئێستا چاوم کە چاوەڕێی دیدارێکە
لە حەسرەتی دیتنی دیمەنی باڵات
لە ئاهی خۆزگەی بێ سنوور
بۆ لانکۆڵەی حەوانەوەی نیگاییکت
دەستەوداوێنی ئاسمانم
ئەوکاتە بێی
خونچەی وشەم دەپشکوێنی
ئەگەر بڕۆی
شەهید ئەبن شێعرەکانم
...

لەم چەمەڕا گیان پسێنە

«ئەی کەی داری بەزەیی خواوەند دێتە بەر»[13]

چاوم سوٚمای نەما لە تەمەنای بەژنی شیرین

هاوار ئێوەن و خواتان

بوٚچی شیرین، ئەمڕوٚ لە ماڵ نایێتە دەر؟!

بوٚچی شیرین نایێتە دەر؟!

بوٚچی

شیـــرین

نـــا

یـــێ

تـــە

دارەك بێ

موبـــارەك بێ...

.

.

---

[13] لە ماموٚستا هێمن موکوریانی

□

بۆکوێ ئەڕۆی بە جێم دێڵی

ئەی نازەنینەکەی دایە؟

خۆت ئەزانی ئەو دڵەی من هەردەمە لە شوێنتایە

لێوی سوورکەن وەک دڵەکەم

چاوی ڕەش کەن وەک رۆژگارم

خوا بیزانێ

_دوور لە باڵات

شێت و هارم

رووت کردە ماڵی ئەغیار و

یادێ لە من ناکەیتەوە

خۆت وەک شازادەی چیرۆکێ لەم شێعرەما ئەحەسیەوە



فەرهادکوژان وەسڵ ئەنجن ئەنجن ئەکەن

لە جێژوان بێزیان دێتەوە

هەڵئەهێڵنجن لە بۆنی بزە و نیگا و دڵداری

هەرچی شێوەی هێرۆ بدات

بە توونی ئاگری ئەبەن

گەرمەقین، گەرمە بازاڕی

گوێ دەئاخنن

نە وەکوو ئایەتەکانی فەرهادنامە

"صراط الحب" یان فێر بکات

نەبا سوورەتی "زاڵە" کان

خوێنی "عەشق و ئازادی" بخاتەگەڕ

بەرەو ترۆپکی ئارەزوو هانیان بدات

ویستی شیرین لە لای ئەوان قیزەون و ناشیرینە

خۆگیل ئەکەن لە تەلاوەتی گۆرانی و بەستەڵەی ئەوین

حاشا لە ئەفسانەی بێستوون ئەکەن

چڕنۆک ئەبەن بۆچاوی فەلسەفەکانی ئەم ژینە

بۆ نازانن مەلی دڵی شیرین

هەودا هەودا هەوار ئەبڕێ

سەر لە کۆچگەی بێستوون ئەدات؟

ئەی نازانن شیرینە خوێن شیرینەکەم

پەڕەی مێژوو بە فرمێسکی غەدری ئەوان ڕەنگین ئەکات؟

لەو دەمەیدا بێستوون هەزار

فەرهاد هەژار

فەرهادکوژان خزانەتە ژوورێکی تاریک و چەپەڵ

مانیفیستی فەرهاد کوشتن

یاسای درۆ و تاڵان کردن ڕەشنووس ئەکەن

لە حەیبەتی هەڵدانەوەی چرۆی جەستەی پاکی فەرهاد

بێستوون بێستوون خەم بەکۆڵی فەرهاد ئەدەن

خەم بەگژی فەرهاد ئەدەن

# خۆ من وەک تۆ نیم

من ناتوانم وەکوو تۆ بم
جێت بهێڵم لە هەواری بێ هاوارا
خونچەی عەشقێک نەپشکوێنم
لە قات و قڕی پائیزی تاقەداری بێ بەهارا
من ناتوانم قەڵای شادیت بڕوخێنم
هەرچی پشکیلی دڵخۆشیت حەشار دابوو
بێ بەزەییانە بیچوێنم
لە دەستم نایێ گەردی ڕێی هیچ دڵدارێک بتەکێنم
نەکا پەڕەی دڵی لەش ناسکێ
یان خود شۆخێک بژاکێنم
من ناوێرم هەست و نەستی هەتاوی بن هەناوی کەس
بدەم لە سێدارەی مەغریب
نە با دەخیلی هەناسەی شین و واوەیلا و ڕۆ ڕۆ بم
چبکەم بە دەستی خۆم نیە
من ناتوانم وەکوو تۆ بم

# شیرین ئاگات لە خۆت بێ

تاو تاو لە گەڵ هەناسەما
بە رۆخمدا چۆ ناخەوە
با بزانی زامی سەختی زەختی دووریت
هەرگیز بۆ من زاخاو نادرێ
تاو تاو لە گەڵ شنەی خەیاڵی بێ سنوورمدا
باڵ بهاوێ بۆ ترۆپکی بەرزی ئاسمان
خەمت نەبێ لە تاوانی ئەو هەموو بێ وەفاییەتا
لە ئەم ئاژاوە بازارەی نا حەقیەدا
خوا ناتگرێ
بەڵام گیانە دەخیلت بم
خۆت لە قامووسی دڵداری بشارەوە
نەبا هەناسەی هەنیسک و شێعر و باران
گریە و فرمێسک و جێژوان
کزەی دڵی وشەی عەشق یەخسیرت کا لە ناخمدا
لە بەرزایی ئاسمانەوە گێژت بدا و بتهاوێتەوە خوارەوە

# زنجیرەی تاوان و سزا بۆچی؟!

خوایێ کە تۆی بە من ناسان

سەوداسەری کام ئازار بوو؟!

کامە تاوان شیاوی ئەم سزا بێ برانەوەیە

مامەڵەی ئەم دڵداریە

سفتاحی کام چۆڵگە و کەلاوەیێکی بازار بوو؟!

شێعر و فرمێسک ویادی تۆ

ئەڵقاوێزی گریانمە

تۆی کەمتەر خەم

منیش هەڵوەدای عەشق

سەرم سوورە لە یاسای خوا

ئاخر چلۆن دەکرێ؟

ئەو گوناحەی کە تۆ ئەیکەی

سزا و جزای تاوانمە!

# له مه‌كته‌بخانه‌ی شیرین‌دا

چیرۆكی ئه‌م عه‌شقه‌ی ئێمه بێ كۆتایه
له چاره‌نووسی ئێمه وه‌ها نووسراوه:
"ناهێڵین سروه‌ی خه‌یاڵ بسره‌وێ
چیرۆكی دڵداریتان كۆتایی نایه"
...
سه‌ر ده‌ر ناكه‌م !
له‌كه‌ین و به‌ینی جه‌بر و ئیختیاری چه‌پ‌گه‌ردی گه‌ردوون
بۆچی ده‌گێڕێ ئه‌وگه‌ڕ و قینه
بۆچی گیرۆده‌ی عه‌شقێكمان ئه‌كات
بۆچی دابڕان و
بۆجوانی دروس ئه‌كا و ئه‌ڵێ مه‌یبینه!
كێ تاوانباری غه‌دری هیجرانه؟
ئاخۆ جه‌بره و باڵی ده‌كشێ به‌ سه‌ر بێستوونی قینه‌وه

یاخود ڕەقیبی نەیارە

یاکوو وەیشوومەی تالعی ڕووی نەهاتە

یا "خوێنی فەرهادە و گوناحی وا بە سەر شیرینەوە"[14]

...

تۆ ڕاستت وت شیرین خانم

قەدەر داوی خۆی دەتەنێ

کزە دەهاوێتە دڵان

ئەوسا قرچە و کسپەی ژانی دووری و لێک دابڕان

چمان لە دەس دێ بە تەنێ؟

قەدەر داوی خۆی بتەنێ!

ئێمە گیرۆدەی گێژاوی جەبرین

بیج بیجەی[15] دەستی گەڕی گەردوونین

[14] مامۆستا ناری

[15] وەویلکە یان بووکە شووشەیێکە کە ئەکتەرێک بە دەست شانۆی پێ دە گێڕێ/عروسک خیمە شب بازی

دەوری گەڵاڵەی لە پێش داڕێژاوەمان ئەگێڕین
بە دڵی گەردوون بێ
جا ئەوسا ئەمرین

...

خۆ عەشق نەبێ چی بوونی هەیە؟
تووڕەی کام خەرمان خەلە و دانی بێ
بەرهەمی تیشکی گزنگی عەشق و دڵداری مەیە
لە بە سەرهاتی دوایین هەواڵمان
لە گەڵ فرمێسک و ڕقی ئەم جارەی خۆشەویستیمان
خەجاڵەتی رووی فەرهادنامەش بووم
خۆ نەمدەزانی جەبر یاسایە
هەر بە خۆڕایی خۆم ماندووت ئەکرد
بە هەڵەدا چووم
بۆ هەرلایێ چووم
زۆر پەشیمانم لە حەوڵی بێ سوود

منیش تەسلیمم بە دەوری دەوران

ئەوەی کە دەژین بۆ گەڕی گەردوون بە خێر و بێرین

منیش کەلەبچەی فەلسەفەی تۆ بووم

جوان دەرست دادام مامۆستا شیرین

## شێعرەکانی فەرهاد

شێعرەکانم

مەگەر پەپوولە بوون

لە سەر باڵت نیشتنەوە و

پێت نەزانی؟

یا خود مۆمی عەشق

گڕی تێ بەردان و

بۆ نەورۆزی دڵداریمان بوو سووتانی

□

ئەڵێی کێڵی مەزارێکم
ناو و نیشانی کەسێکیان لە سەر سینگم هەڵکەندوە؛
هێندەی شیرین دڵداری بوە، ژیاوە
کە شیرین چوو
چرای عومری کوژاوەتەوە و مردوە

□

چاوەکانت پەڕەسیلکەن
بە ڕۆژ تا شەو
لە ئاسمانی جەستەی منا هەڵدەفرن
کە شەو دادێ
لە هێلانەی دڵی مندا ئۆقرە دەگرن

□

ئەبرۆکانت جووت پەیوەستن

دەستیان لە دەستی یەك ناوە

بۆ دڵ بردن

ڕێبوار کوشتن

□

باوانەکەم

وا نەزانی مەمکەکانت جووتێ سێون بە دارەوە

بۆ من ئەبنە فەلسەفەی ژین

گۆرانی عەشقم بۆ ئەڵێن

تکا ئەکەم مەیشارەوە

لە سایەی سینەتا خاڵێ

لە حەشارگەی ملوانکەوە

کە شاهیدی کەین وبەینی تەلیسمی بزە و نیگایە

چیرۆکی ماچ ئەنووسێنی بە لێوی لێو بە بارەوە

کە ئەتوانیٚ هەژانم بێت

هەرچی هیلاکی عومرێکە لە جەستەما رابماڵیٚ

بێتە خشڵی گریاشانی بێستانێکی ئەم شارەوە

خوا پێی داوی مەیشارەوە

تکا ئەکەم مەیشارەوە

□

دە وەرە دەی

دڵم وریای ویردی لایەلایەی شەوانەتە

دەخیلت بم

ئەمجاریش دڵم مەشکێنە

جێم مەهێڵە و

بۆ ئەمشەویش لە سەر سینگی مێهرەبانی

لە باوەشی کامەرانی

لە پێخەفی پرچی لوولت بمخەوێنە

□

بزر نابم لە تاوی سێحری تیلەی چاوەکانت

غەوارەی غەدری برژۆڵت نابم

نامۆیی شەوی گڵێنەکانت دەیجوورم ناکات

ئامێژەنم بکە بە تاڵێکی نیگاتەوە

تەلیسمی وێردی کچێنیت نابم

لە بارەگای ئامێزتدا خۆڕاگرم

بۆ هەوەسی شەمامەییێك چۆك دا نادەم

دەی ڕێم بدە بادانیشم بەلاتەوە

هۆ ترووسکەی هیوای ژینم

لە ژێرڕێژنە بارانی ناز و شەرمەوە

ئاژینم کە لە باوەشی خەیاڵتدا

با ئەم شەویش شەوەی خەون و خولیات بە هێمنی بمباتەوە

□

ئەتۆ مەسیلەی عەشقێکی تەژیت لە پرسیاری نامۆ
گێژاوم لە گێژاوی‌دا وبۆم هەڵنایێ
تۆ پەنگاوی هەنیسکێکی
قەتیس ماوی لە فرمێسکم
تۆ سەمفۆنیای ئاوازێکی
سووتای لە تەنوورەی سازم
تۆ مۆسیقای گورانییێکی
بزر کرای لە ئاوازم
سترانێکی، هەرچی ئەکەم دەنگم نووساوە و بۆم نایێ
تۆ وەنەوشەیی‌ترین چەپکە گوڵێکی
کە سروشتی خودا پیداین
پیرۆزترین هێمای عەشقی بۆ رۆژانی بەختەوەری
پەیکەری تۆ ئەکەم بە بت
بۆ یادی بەرزی واڵتناین

□

هانێ خەنجەر گەر دەمکوژی[16]

کوشتەی خۆتم

لە کـــــەوانی برۆتەوە تیـــری برژۆڵ بۆ دڵ ئـەبەی!

خۆ تۆ نەبی

من لە سۆزی وشە و ئیکسیری عیشوەی حەرف نازانم

شاعیرێکم بێ ناو نیشان

دێڕەکانم گۆش کراوی چرپەی خۆتن

هەربۆ خۆت کۆرپەی ساوای شێعرم مەلۆتکە ئەکەی!

ئۆباڵ ئەستۆی خەزانی بێوادەی تەمەنمی

عومری گەنجیم لە ڕێت دانا

ریشت پێ سپی کـردم و تانـەی پیریـــشم لێ ئەدەی؟!

---

[16] حەسەن زیرەک

***

هۆ کەنیلی

تۆ نازانی من دڵدارم و

یاد و بیرت جێـژوانمە؟

منی بەستەزمان یەخسیری داوی زوڵف و

دانەوێڵەی خاڵەکانت پاوانمە

وا نەزانی ئاسـۆی نیگام

بۆ دیداری بەژن و باڵات هەتەر نادات

یاخود باڵای سۆزم کورتە بە باڵای عەشقتدا ناگات

" لە ساردی نیگات

عەشقم لە گۆ ناکات"

«شیوەنی شیعر»[٧]

شەو و شیعر و شیوەنی دڵ سێ شینەی شەوگاری منن

خەم و ژان و دەرد و مەینەت، مەتاعی بازاڕی منن

لەو ساوە شیرین ڕۆیشتوە و جێی هێشتووم لەم تەنیایەدا

بێوەفایی و بێ بەڵێنی ئاوەژۆی ئازاری منن

بێ تۆ دونیا لە دەورم بێ هەرهەست بە تەنیایی ئەکەم

بێکەسی و بێ هاودەمی دڵ، هاوسەرەکەی شاری منن

بارانی فرمێسک دەبارێ بە سەر مەزرای ڕوومەتمدا

لێو بەباری و باری مەینەت سەربارەکەی باری منن

یادی بەخێرچاوەکانت چاووگی شێعر و غەزەل بوون

شیوەنی شیعر و دڵتەنگی ئەمێستا ئەشعاری منن

ڕووی کردە ماڵی ئەغیار و بەجێی هێشتم دڵدارەکەم

فرمێسک و یادی شیرینم جێژوان و دڵداری منن

لە باخی گوڵ و خشڵی دەنگ من گوڵ و بولبولم بۆ چین؟

شێوەی شیرین و چرپەی پێت دیمەن و هەزاری منن

من ناتوانم لە بیرت کەم شیرینەکەم هەر لە یادمی

یاد و بیری چاوەکانت هەردەم پیشە وکاری منن

هەزار بێستوون دەوری داوم هەررۆژە نوێ دەکرێتەوە
خەمی نان و بر کی دەوران بێستوونی پێراری منن
کە بیرت لێ ئەکەمەوە تۆزێ دڵم ئەگرێ ئارام
بیرەوەری و یادت ئۆقرەی ئەو دڵەی هەزاری منن
ئەڵێی فەرهاد رادەبووری فەرامۆش ئەبێ دەردی هیجر
وا نەزانی سارێژم ئەکەن ئەم قسانە ژاری منن

## مەمدە بە دەس ماڵاوایی

شیرین نەڕۆی لەم هەوارە
لە خێوەتی دڵداریمان
لە رەشماڵی خۆشەویستی
سەودای سەری عەشقی تۆیە
هە ناسەیێک دێت و دەڕوا

بریسکەی دێ بۆ دیدارێک
ئەم جێژوانە تاسەبارە
شیرین نەڕۆی لەم هەوارە

...

کە بیرت لێ ئەکەمەوە
خێرا فرمێسک دزە ئەکاتە چاومەوە
ئازا ناموێیی دامدەگرێ
بەندی دڵم سووک و ئاسان
بە دەم یادی تاڵێ زوڵفت ئەپسێتەوە
ناوێرم دەس بەم بۆ وشە
دەس بە جێ لێم ئەبێ بە شێعرێک و
هێندەی تاسە و خەمی دووریت
خەفەت درگای لە سەر پشتە و بە ڕووی دڵما ئەکرێتەوە
گلەیی بێت شیرینەکەم
مەگەر نەموت تاڵێ زوڵفت دەخیل بدە بە دەسمەوە

هەرکاتێ شێعرم لێ پژا
هەرساتێ بەندی دڵ پسا
بە زوڵفەکەت دەیبەسمەوە؟

...

مەمدە بە دەس ماڵاوایی
دام مەبێژە بە بێژنگی خەم و مەینەت
مەمخە زەریای ئازارێکی بێ کۆتایی
کە ئەتزانی بۆ من نابی بۆچی گیرۆدەی خۆت کردم
ئەدی بۆچی بە بارمتە
بۆهەواری بێ ئاکامی عەشقت بردم
هۆ کاڵەبەی
بەفری سەر لووتکەی کێوێکم
بە تینی تاویش ناچمەوە
دەس هەڵگری باڵات نابم
جێت ناهێڵم، لێت نابمەوە

تۆ ڕێبواریت و منیش ڕێم
لە هەرلابی وەکوو سێبەر بە دواتا دێم
لە تاوی خواحافیزەدا
لەشم نابێ بە خانەخوێی مەلی ڕۆحم
چاوەکانم گۆمی خوێنن
لە ئازاری شین و گریان
کە نامناسی لە من مەگرە
هێندەی لە من دوور کەوتیەوە
لە خۆم غەریبم شیرین گیان
بۆ لە حاستی عەشق ئەتاری و
بزەم ئەتۆرێنی بە تاو
شیرین
دیتت لە من ناگەی!
"لە من تا تۆ هەنگاوێکە
لە تۆ تا من هەزار هەنگاو"[17]

[14] نازانم لە کێم وەرگرتوە. داوای لێبوردن لە خاوەنەکەی ئەکەم

هەتا فەرهاد بژی و

شیرین مابێ

فەرهادنامەش تەواو نابێ ...

## هەرلەم نووسەرە ؛

## (ئامادەی چاپ)

ستران، پژوهشی در موسیقی کردی ........................ (رساله دانشگاهی)

کاوشی برچند قطعه شعرازفریدون مشیری..................(نقد وکنکاش زیبایی شناختی متن)

بازخوانی یک متن ادبی کردی عهد صفویه............... (ادبیات تحلیلی)

مجموعه مقالات...................................... (هنری،فرهنگی،ادبی)

## (له نووسین دایه)

پیربەیاخ ................................................ (کۆمەڵە ئاواز)

هۆرە و حەیران و سیاچەمانە ................................ (لێکۆڵینەوە)

انسان بدین سان .......................................... « تحلیلی بر مکاتب اومانیستی»

